**توێک/** قشر، قشرة، قرفة، جلبة، طبقة.

**توێکاری/** تشريح.

**توێ کردن، توێ کردنەوە/** عمل شرائح، تقطيع اللحم بشكل شرائح وطبقات، تشريح.

**توێکڵ/** قشر، قشرة، جلد، طبقة، هَيْكَل.

**توێکڵدار/** قشريات، له قشر.

**توێکڵدارەکان/** القشريات.

**توێنەر/** مُذيب، مُحَلَّل، إسم الفاعل من **(تواندنەوە)**.

**تە/** أنتَ، أنت.

**تەبا/** مُتَّفِق، موافق، مُنْسَجِم.

**تەبا بوون/** إتفاق، توافق، وئام.

**تەبارە/** الحد الفاصل بين قطعتين من الأرض وعادة يكون بالاحجار، جدار حجري في الأراضي المنحدرة – الحنطة والشعير الجاهز للحصاد.

**تەبارە بوون/** نضوج الحنطة والشعير.

**تەباشیر/** طباشير.

**تەبانە/** محدلة السطوح.

**تەبایی/** موافقة، إتفاق، قبول، قناعة، إنسجام، وفاق.

**تەبر = تەور.**

**تەبەتە/** إبرة أو مخيط لنسيج الكلاش، إبرة كبيرة

**تەبەش/** غنم أبيض مع بُقَع سوداء على الرأس.

**تەبەق/** الحمى القلاعية، مرض في حافر الماشية، مرض تعفن الظلف، دَخَس – طبق، صحن، صفيحة.

**تەبەقەترانە/** ما يؤخذ من شخص حينما يَضْرِط بين الآخرين.

**تەبەک/** طشت خشبي.

**تەبەنە = تەبەتە.**

**تەبیات/** شَهيَّة، رَغْبَة، إشتهاء.

**تەبیات بردن/** إشتهاء، وجود رغبة وشهية للأكل.

**تەپ/** حركة أو صوت الصفعة أو اللطمة أو السقوط – كسلان، بطيء – فضلات وبراز الإنسان أو الحيوان – تل أو مرتفع صغير.

**تەپاڵە/** جُلة، روث أو دمان البقر المجفف بشكل أقراص، مسْكَة، جلة الوقود.

**تەپان/** عَقب الباب – خَشبة توضع أسفل الرحى في المطحنة المائية.

**تەپان = تەپین.**

**تەپاندن/** خَسف، هَدم، فَعْص.

**تەپاوتل/** تَقَلُّب، تَدَحرج، تَمَرغُل، تَمَرغ في الفراش، تَضَوُّر.

**تەپ پیادان/** صَفع، لطم، الضرب الفجائي.

**تەپخ/** ساقط، متهدم، مُنهار.

**تەپخ بوون/** سقوط، تَهَدُم، إنهيار.

**تەپ دان/** تجميع، تَكَوُم.

**تەپرەش/** مَكّار، حيّال، مخادع.

**تەپشو = تەشوێ.**

**تەپک/** جُلَّة، روث ودمان مجفف ومعمول بشكل أقراص – فخ لصيد الطيور.

**تەپکە/** رابية، هضبة، أكمة، متراس – فخ لصيد الطيور – كوم من البراز أو الغائط.

**تەپل/** بصمة الأبهام.

**تەپلک/** الجدار المائل.

**تەپلۆس/** كسلان، عاطل، مبهدل، شعث.

**تەپلە/** طاقية من اللباد.

**تەپڵ/** طبل، طبل صغير، نقاريَّة – قمَّة، نهايَة.

**تەپڵ ژەن/** طبّال، الضارب على الطبل.

**تەپڵ لێدان/** الضرب والدقّ على الطبل.

**تەپڵە/** رأس، قُمّة، ذَرْوَة، نهاية.

**تەپڵەسەر/** قمة الرأس، هامة الرأس.

**تەپڵەقوو/** شجرة تصنع منهُ السهام.

**تەپڵەک/** طبلة، نفاضة السجاير – طبلية، منضدة صغيرة – جلد لترقيع القربة.

**تەپڵی باز/** طبل الصيادين.

**تەپڵی تۆپێن/** لعبة شعبية بالكرة فيها شيء من الخشونة والقساوة.





**تەپڵی سەر = تەپڵەسەر.**

**تەپڵی گوێ/** طبلة الأذن.

**تەپۆ/** بليد، غبي، مُغَفَل، خبل، بارد الطبع، ثقيل الحركة – نوع من البعوض طويل الارجل.

**تەپۆکە/** تل صغير، رابية، قُنّ، قُنَّة، مرتفع.

**تەپۆلە = تەپۆ.**

**تەپۆڵکە = تەپۆکە.**

**تەپ و تل = تەپاوتل.**

**تەپ و تۆز/** غبار، عجاج، هباب.

**تەپ و دۆڵ/** أرض متموجه، مرتفعات، منخفضات.

**تەپ و دوکەڵ/** دخان، دخان كثيف.

**تەپ و کۆ/** سقوط، المشي بَتَعثُر، سقوط بسبب ضعف البصر.

**تەپ و کوت/** ضرب.

**تەپ و مژ/** ضباب، طَلّ، سديم.

**تەپ و نم/** مطر خفيف، طَل، رذاذ، هميمة.

**تەپ و وڕ/** أصوات خافتة أو صاخبة متكررة.

**تەپ و هوڕ = تەپ و وڕ.**

**تەپە/** هضبة، تل صغير، رابية، قُن، قُنَّة – صوت السقوط.

**تەپەتڕە/** طفل حديث المشي، يسقط ويقع أثناء المشي، يمشي ويتعثر، واهٍ، مسترخي الرباط.

**تەپ تەپ/** صوت الأقدام، طبطبة، أصوات خافتة متكررة.

**تەپەدۆڕ/** فلين، سُدادَة القنينة.

**تەپەدوکەڵ/** دخان، دخان كثيف.

**تەپەرییک/** كثبان، ملية.

**تەپیان = تەپین.**

**تەپین/** خسف، هدم، سقوط، إنهيار، هبوط، تدهور صحة الإنسان.

**تەپیو/** مخسوف، خاسف، مُنهار، مُهدَّم.

**تەتک/** كفوف، لباس الكَف، قُفَاز.

**تەتلە میيران/** نوع من الديدان.

**تەتە/** مليح، جميل، لُعَب الاطفال.

**تەتەر/** مُراسل، مُوَزِع، مُوَصِل الرسائل – نشيط، حَرك، سريع في المشي – لَصّ، قاطع طريق.

**تەتەڵ/** غربلَة – أسفل الظهر.

**تەتەڵکردن/** عملية الغربلة وتنظيف الحبوب – عدم إصابة الهدف.

**تەتەڵەمیيران/** نوع من الديدان.

**تەچە/** تَيْس، فحل أو ذكر الماعز بعمر أكثر من سنتين.

**تەحاتەحا/** إشاعة، دعاية، كلام وأقاويل تتردد على الألسن.

**تەحر/** نوع، صنف، جنس، شكل، كيفية، منوال، أسلوب.

**تەخت/** مَضْجَع، سرير، عَرش، كرسي خشبي، مَقْعَد – سهل، مُنْبَسط، مُسْتوي، مُمَهَّد، مُسَوَّى، مُنْبسَّط.

**تەخت بوون/** تَسْوِيَة، مُعَدَّل، مُبَسَّط، ممهد.

**تەخت ڕەوان/** هودَج. محَفَّة. مَحْمَل.

**تەخت کردن/** تسوية، بَسْط، تعديل، تمهيد، تحطيم، قهر.

**تەخت وتاراج تێک دان/** تحطيم، قهر، تَغَلُب على، تدمير.

**تەختە/** لوح، لوح خشبي، خَشَب.

**تەختەبەند/** سرير خشبي.

**تەختە پۆش/** مُبَلَّط ومرصوف بالحجر – غطاء خشبي.

**تەختەدار/** لوح خشبي.

**تەختەڕەش/** سَبّورة، سبورة سوداء.

**تەختە ڕەوان/** هودج، مَحفَّة، مَحْمَل.

**تەختە سڕ/** مَسّاحَة، مِمْسَحَة، طَلاّسَة، خِرقَة يُمسَح بها اللوح المكتوب.

**تەختەک/** رحلة المدارس.

**تەختەکالۆس/** أرضة، حشرة الإرضة.

**تەختی پاشایی/** العرش، الكرسي الملكي.

**تەخەن/** دريس، كوم أو كدس من أوراق النباتات.

**تەرا = تاک و تەرا.**

**تەرابوون/** سقوط من أعلى إلى أسفل – تَشَرُّد، هيام، إبتعاد.

**تەراتێن/** رواح ومجيء بسرعة، ركض، مطاردة، تراكض.

**تەراخومە/** تراخومه، مرض التراخومه في العين.

**تەرار/** إناء صغير لشرب الماء.

**تەراز/** متقابل، متوازن، متعادل.

**تەرازوو/** ميزان، قَبّان، شاقول البناء، قسطاس.

**تەرازووباز/** المتلاعب بالميزان.

**تەرازووبازی/** التلاعب بالميزان، سَرِقَة.

**تەرازوومەند/** تعادل، توازن، الميزان الصحيح، الوزن الصحيح.

**تەراش/** حلاقَة، زيان.

**تەراش کردن/** حلاقة، تقشير، حلاقة الشعر أو اللحية.

**تەرانە/** إيقاع، لحن، غناء.

**تەرانە ساز/** عازف الألحان، مؤلف، أو ملحن الأغاني والموسيقى.

**تەرت/** مشتت، مُبَعْثَر – مفقود، مُنتهى – مَدَر، مَدَرَّة، طينة جامدة – لوح من الحجر.

**تەرت و توونا = تەفر و توونا.**

**تەرتوول/** دودة خضراء اللون، من ديدان الخضروات.

**تەرح = تەحر.**

**تەرخان/** مُخَصَّص، خاص، مُكَرَّس.

**تەرخان کردن/** تَخصيص، تَكريس، تَعيين، تَحديد.

**تەرخوون/** طرفون، نبات من نوع الشيح.

**تەرز/** حَوْلَق، محلاق، عَنَمَة، سلك النبات، خيوط يتعلق بها الكرم والنباتات المتسلقة– الفرع حديث النمو، القمة النامية

**تەرز فڕێ دان/** نمو أفرع جديدة في النبات، زحف النبات، نمو الحَوْلَق والعنمة.

**تەرزکردن = تەرزفڕێ دان.**

**تەرزهاویشتن = تەرز فڕێ دان.**

**تەرزە/** حالوب، بَرد، حَبّ الغمام، مُزْنَة.

**تەرزە بارین/** نزول أو سقوط البَردَ أو الحالوب، مُزنَة، مَطْرَة بَرد.

**تەرزە شکێن/** تدمير، تخريب، إقفار، إتلاف النباتات بسبب الحالوب.

**تەرزەکوت = تەرزە شکێن.**

**تەرزە کوتان/** حدوث أضرار وتلف بالمزروعات بسبب الحالوب.

**تەرزە لووکە/** مطر خفيف مع برد أو حالوب.

**تەرس/** جُلّة، بَعْر الحصان والدواب، رجع، روث.

**تەرسەقول/** جُلّة، بَعْر الحمار، رَجْع.

**تەرش/** الحيوانات الأليفة، غنم، ماعز، دواب، أنعام.

**تەرشداری/** تواجد الحيوانات الأليفة وتربيتها.

**تەرفک/** خَيْط، حَبْل.

**تەرک/** فَصخ في قوائم الدواب – القسم الخلفي من السرج – مخشلات نسائية، حالوب.

**تەرک بەند/** سير جلدي لِشَدّ الجزء الخلفي من السرج.

**تەرک کەوتن/** حدوث فصخ في قوائم الدواب.

**تەرکە/** نبات يصلح لصناعة الورق، بَرْدي.

**تەرکی/** مؤخرة السرج، الجزء الخلفي من السَرج.

**تەرم/** تابوت، جُثة، جثمان، رُفاة، جُثة الإنسان الميت.

**تەرماڵ/** عجْز، كَفَل الحيوان.

**تەرو/** شجرة دائمة الخضرة، نبات الأثل.

**تەرواڵ/** مَصْطَبة، عريش.

**تەرواڵە = تەرواڵ.**

**تەرە/** ضالّ، شارد، تائه.

**تەرەبوون/** تَشَرُّد، ضَلّ، تَيِّه، شَرد، بَهْدَلَة.

**تەرەس/** ديوس، قَواد.





**تەرەقە/** كبسولة، كبسولة البندقية.

**تەرەکردن/** تشتيت، طرد، إبعاد.

**تەرەکیین = ترەکیین.**

**تەرەکیینەوە = ترەکیینەوە.**

**تەرەوون/** شجيرة مائية مُرّ الطعم.

**تەریب/** دَرز، خَطّ الأبرة – موازي، موازٍ، متواز، مُحاذي.

**تەریب بوون/** تواز، موازاة، محاذاة.

**تەریب دان/** الخياط باليد.

**تەریبە/** قاطع طريق، لِصّ، حَرامي، قرصان، شقي.

**تەریق/** خَجِل، خَجلان، مكسور الخاطر.

**تەریق بوونەوە/** خَجَل واستحياء من.

**تەریق کردنەوە/** كسر الخاطر، خَجل، تحقير، إهانة، زَجْر، إجلاء، إفشال.

**تەریقی/** خَجَل، حياء، إستحياء، إحمرار خجلاً.

**تەریک/** منعزل، منسحب، منزوي، منفرد، خجول، غير واثق من نفسه.

**تەریک بوون/** إنعزال، إنفراد، إنزواء.

**تەڕ/** مُبَلَّل، بلول، رطب، مرطوب، مُنَدَّي، مُبْتَل.

**تەڕاف/** حجاب الحاجز.

**تەڕاف کردن/** تقليم أشجار الكروم أشجار البساتين.

**تەڕاڵ/** كسلان، متوانٍ، عاطل.

**تەڕاو/** مَلاط، بَياض، تبيض الجدران.

**تەڕاودان/** تبيض الجدران بالملاط.

**تەڕاوس/** زراعة الحبوب والنباتات بعد مطرة الوسمي.

**تەڕایی/** مكان رطب، رطوبة، بَلَل.

**تەڕبوون/** تَبَلُّل، بَلَل، تَرَطُّب.

**تەڕبوونەوە/** زواج رجل كبير العمر من بنت صغيرة في العمر.

**تەڕبی/** كرز أحمر بَرِّي، شجرة قراصيا.

**تەڕپۆش/** أنيق، متأنق في الملبس، كبير في العمر وأنيق في الملبس.

**تەڕپیر/** كبير في العمر يعامل معاملة الشباب.

**تەڕچک/** طري، جديد، الخضروات الطرية الجديدة.

**تەڕدەست/** بارع، حاذق، شاطر، ماهر، خفيف الحركة، نشيط.

**تەڕدەستی/** براعة، حذِق، شطارة، مهارة، نشاط.

**تەڕدەم/** بحبوح، رقيق في الكلام والحديث.

**تەڕزمان = تەڕدەم.**

**تەڕفام/** ماهر، مقتدر، شاطر.

**تەڕک/** الحَطَبْ الأخضر.

**تەڕکردن/** ترطيب، بلل، تبليل.

**تەڕکردنەوە/** إعطاء العلف الأخضر إلى الحيوان بدلاً من الحنطة والشعير.

**تەڕکەوتن/** فسخ في قوائم الحمير.

**تەڕلان/** ذكر الباز – أنيق، رشيق، حسن الحَبْر والسَبْر – جثيث، ضخم.

**تەڕ لە/** عشب ربيعي بَرِّي.

**تەڕماڵ = تەرماڵ.**

**تەڕن/** خسارة، فقدان، ضرر، ضياع هباءً، أذية، مكروه.

**تەڕن پێ کردن/** إحداث وخلق خسارة أو مكروه أو أذية، غَشّ، خداع، مكروه.

**تەڕنەبابیلە/** طير الأبابيل.

**تەڕنەبوون/** تقال للشخص الذي لايبالي بأي تعنيف أو تحقير أو إهانة أو زَجر أو عقوبة.

**تەڕوبڕ/** مُبَتل، مُبَلل، رطب، ندى، مُخْضَر، جديد وطري، رَيّان.

**تەڕوتازە/** جديد وطري، رَيّان، جديد.

**تەڕوتفاق/** مُؤَن، ميره، زاد، أثاث، مهمات، ذخائر.

**تەڕوتووشی/** الجو الممطر، عواصف وامطار ووحل، الجو الشتوي.

**تەڕووشکی/** البرمائيات.

**تەڕ و وشکی کردن/** قرعة، إلقاء القرعة برمي حجارة مسطحة أحد وجهيها مُبْتَل.

**تەرە/** مخضرات وفواكه.

**تەرەبار/** حمل الفواكه والمخضرات.

**تەرەبەهار/** ربيع كثير المطر.

**تەرەبیبرۆ/** مرض جلدي رطب، اكزما مرطوبة.

**تەرەپیاز/** بصل أخضر.

**تەرەتۆڵەکە/** خُبّاز، نبات الخُبّاز، تعبير يقال كمثل للرخص، زهيد الثمن.

**تەرەتوو/** ثمر التوت الطازج.

**تەرەتیبزە/** شاد، نبات الرشاد.

**تەرەدین/** مختل العقل، مجنون، أرعن، أحمق.

**تەرەزا/** حيوان حديث الولادة.

**تەرەزەن/** عشب زكي الرائحة - الكلمة تطلق على أنثى الحيوان الوالدة حديثاً حليبها غزير وخفيف القوام، بقرة أو جاموسة تَحْبَل قبل أن يجف حليبها.

**تەرەژن/** المرأة الكبيرة العمر التي تتعامل معاملة الشابات.

**تەرەساز/** طعام يصنع من جريش الحنطة والشلغم.

**تەرەساڵ/** سنة غزيرة المطر.

**تەرەفرۆش/** بائع المخضرات، خُضَري، بَقّال.

**تەرەکاڵ/** المحاصيل الصيفية، الزراعة السيحية، الزراعة بعد مطرة الوسمى.

**تەرەماش/** نبات الماش الأخضر - الكلمة تطلق على الكلام الفارغ، تافه، أشياء تافهة.

**تەرە ماڵە/** صَقل الملْج.

**تەرەنداز = تەرپۆش.**

**تەرەنیا = تەرەکاڵ.**

**تەرەوون/** شجيرة مائية مُرّ الطعم.

**تەرەوەز/** نثر البذُور بعد المطر.

**تەریی/** رطوبة، بَلَل، نَداوة، طراوة، مكان رطب، نُدْوَة.

**تەرپیزە/** عجْز، أرداف الإليتان، ربَلَة، الخاصرة، مؤخر الشيء، كَفَل.

**تەزان/** خَدَر، إنجماد، تَجَمُد.

**تەزاندن/** تَخدير - تجميد - إيذاء، تعذيب.

**تەزبیح/** سبَحة، مسْبَحَة.

**تەزوو/** تَيار، قشعريرة، رَجْفَة، أرتعاد، حسّ، إحساس.

**- ی کارەبایی/** التيار الكهربائي.

**- ی گۆڕاو/** التيار المتناوب.

**- ی نەگۆڕ/** التيار المستمر.

**تەزوو پێ گەیاندن/** إحداث قشعريرة، إحساس، رجفة.

**تەزوو پیاهاتن/** الشعور برجفة، الاحساس بقشعريرة وإرتعاد، إرتجاف.

**تەزیین/** تَجْميد - تخدير، تنميل.

**تەزیوو/** جامد، مُجَمَد - خدران، مُخَدَّر.

**تەژنە = تیینوو.**

**تەژە/** ذكر أو فحل الماعز بعمر اكثر من سنتين، تيس - عمود - طويل وبليد.

**تەسک/** ضَيقٌ، قصيف، قليل العرض، مطبوق.

**تەسک و تروسک/** ضيق و قصيف.

**تەسە/** طبق الخبز - طشت خشبي.

**تەسەل = تێروتەسەل.**

**تەشپی/** صحن أو طبق خشبي.

**تەشپی ترێن/** أكّال، نَهم، شَره، مُفرط في الأكل، أكول، كثير الأكل.

**تەشپی لۆکە/** صحن أو طبق خشبي صغير.

**تەشپیلە = تەشپیلۆکە.**

**تەشت/** طشت.

**تەشتولکە/** طشت صغير.

**تەشتیر/** عنزة، أنثى الماعز.

**تەشخەڵە/** سخرية، إستهزاء، إحتيال.

**تەشخەڵە باز/** ساخر، مستهزء، محتال، حيّال.

**تەشخەڵە (پێ) کردن/** إستهزاء، إغاظة، إحتيال، سُخرية.





**تەشق/** شدة، برودة.

**- ی سەرما/** العَراة، شدة البرد.

**- ی سەرماشکان/** هبوط وتخفيف شدة البرد، زوال البرد.

**تەشقەڵە = تەشخەڵە/**

**تەشقەڵەباز = تەشخەڵەباز.**

**تەشقەڵە پێ کردن = تەشخەڵە پێ کردن.**

**تەشک/** جَنب، جانب - أسفل - طول.

**تەشکا/** منقلة، مَوْقد.

**تەشکە/** لباد، صغير، زولية، صغيرة.

**تەشکە بەرە/** بساط صغير.

**تەشوو = تەشوێ.**

**تەشوێ/** فأس، قَدّوم، قلع، فأس البناء، مطرقة.

**تەشەر/** تعيير، دَس في الكلام، لمز، إيماءة.

**تەشەر تێ گرتن/** تعيير ودس في الكلام، توجيه كلام ذات معنى وطعن.

**تەشەنە/** مُنتَشر، مَفروش، مُتَسَرب، مُبَعْثَر، مضاعفات.

**تەشەنە تا/** حمى معوية.

**تەشەنە کردن/** إنتشار، بَعْثَرَة، تَسَرُّب، تَوَسُع، سريان، إتساع، إنتشار المرض والجرح.

**تەشی/** مغْزل، مِرْدَن.

**تەشی ڕستن/** غزل أو فَتْل بالمغزل، رَدْن - تملق ورياء.

**تەشی ڕێس/** الشخص الذي يغزل - مُمتلِق، ريائي.

**تەشییلە/** بكرة، مغْزَل.

**تەشییلەیی/** مغزلي.

**تەغار/** ثلاثون عدد من باقة أو شدة خضروات وبعض الأشياء، طَنْيّن من الحبوب - تلميح للفوز وإنتهاء بعض الألعاب الشعبية، إعلان الفوز.

**تەغاراو/** الماء الذي يستعمله الاسكافي لنقع الجلود.

**تەغار کردن/** فوز في اللعب، إنتهاء اللعب.

**تەف/** أحد وجهي عظم البرجمة.

**تەفاری/** صنف من التين الجَيد.

**تەفاریک/** مأجور، شخص غريب عن المنطقة يسكن في الأجار.

**تەفروتوونا/** مُدَمَر، مُباد، مُشَتَت، مُبَعثَر، هالك.

**تەفروتوونابوون/** تشتت، فناء، هلاك، دمار، بعثرة.

**تەفروتوونا کردن/** تشتيت، إفناء، تدمير، هلاك، تخريب.

**تەفرە/** غش، خدع، مماطلة، خيبة.

**تەفرە خواردن/** تخادع، تماطُل، تخديع بالمماطلة.

**تەفرەدان/** إغواء، خَدع، غَشّ، تماطُل.

**تەفرەدەر/** مُخادع، غشّاش، مُماطل، غاوي.

**تەفشوو = تەشوێ.**

**تەڤ/** الكل، جميعاً، معاً، سَوِيَةً.

**تەڤا/** الجميع، جميعهم.

**تەڤایی = تەبایی.**

**تەڤر = تەور.**

**تەڤەر = تەور.**

**تەق/** تَفَرْقُع، إنفجار، ضَربَة، فَرْقَع.

**تەقا/** فرضاً، رُبَما، لرُبما، قد يكون، هبّ، قَدّ.

**تەقاندن/** تفجير، إطلاق - طَقّ الظهر إو أي عُضُو في الجسم.

**تەقاندنەوە/** تفجير الألغام والقنابل وما أشبه - غَربلة.

**تەقاوییت/** متقاعد، مُحال على المعاش.

**تەق کردن/** ضرب وبسط الأطفال - تعب وإرهاق الطفل من البكاء.

**تەقلە/** طاقية - شقلبة - ثمرة التين الساقطة قبل النضج.

**تەقلەباز/** يَمامَة، نوع من الحمام، المتشقلب، الحمام المتشقلب.

**تەقڵە/** شقلبة.

**تەقڵە لێدان/** تَشَقْلُب، وثب في الهواء ثم الوقوف على الرجلين.

**تەقن/** طين، وحل.

**تەقو = تەقا.**

**تەق و دەو/** هروب وهجرة جماعية من الرعب.

**تەق و ڕەو = تەق و دەو.**

**تەق و تۆق/** ضرب، أصوات الاطلاقات، قعقعة السلاح، أصوات وضجيج وضوضاء.

**تەق و وڕ = تەق و تۆق.**

**تەق و هوڕ = تەق و تۆق.**

**تەقە/** قرقعة، إنفجار، صوت الطلق الناري، قعقعة، جلجلة.

**تەقەتەق/** أصوات الضرب والقعقعة المتكررة.

**تەقەکردن/** إطلاق النار أو الرصاص – قنص، صَيْد – توجيه كلمات ذات معنى تدل على الطعن والتلميح.

**تەقەلا/** نضال، كفاح، سعي، مسعى، جُهد، كَدّ، عَمل، همَّة، تَعب، بذل الجهد.

**تەقەلادان/** نَضال، إجتهاد، مسعى، إشتغال بِهِمَّة، كَدح.

**تەقەڵ/** غرِزَة الخياطة، درزة.

**تەقەڵ تێ هەڵدان/** خياطة باليد.

**تەقەمەنی/** متفجرات مفرقعات، مواد متفجرة متفرقعة.

**تەقە و ڕەقە/** ضَرب، قَعْقَعة، جلبة، ضوضاء.

**تەقیانووس = ساڵی تەقیانووس.**

**تەقییلە/** طاقية، لعبة شعبية.

**تەقین/** إنفجار، تفرقع، إطلاق الرصاص، إنبثاق – صوت المفاصل – ظهور وإنفجار الماء من الارض – حدوث وشق في الزجاج، شَقّ، فَلْق.

**تەقینەوە/** إنفجار، إنفجار ثانية ومن تلقاء نفسه – إنتشار خَبَر أو حَدَث – كد، كفاح.

**تەک/** مع – جَنْب، جانب – مفرد.

**تەکـــان/** دفع، دفع من جَنْب على جَنْب – نَفْض الغبار.

**تەکان پیادان/** دفع، دفع من جَنْب إلى جَنْب.

**تەکان دان/** تدافع.

**تەکـان دانە خـۆ/** دفع الجسم للنهوض والحركة والمباشرة.

**تەکاندن/** نفض الغبار، تنظيف، تنفيظ، هَزّ، تحريك لإزالة الغبار، هز وتحريك لنفض وإسقاط ثمر الاشجار.

**تەکاندەر/** نَفّاثَة – متدافع، متزاحم.

**تەکان وەشاندن/** ضرب ودفع المقابل عن طريق الجَنْب أو من الجَنْب.

**تەکانەوە = تەکیینەوە.**

**تەک بەند/** حزام، حياَصة، حزام الدابّة.

**تەک دان/** تقوم، زحف، فسح المجال.

**تەک دانە دواوە/** إنسحاب، تراجع، زحف وتحرك إلى الخلف، فسح المجال.

**تەک کەوتن/** ملاحقة، مُرافَقَة، السير بجَنْب، أو خلف.

**تەک و لۆ = تاک و لۆ.**

**تەک تەک/** تَذَبْذُب، تَرَجُّح، إهتزاز، ذبذبة.

**تەکەدان/** تراصف، تحرك وزحزحة إلى أحد الجانبين.

**تەکەڵتوو/** لباد يفرش فوق ظهر الحصان وتحت السرج، جَدْيَة.

**تەکیە/** مسطبة، مَقعَد، دكَّة – تكية الدراويش، ملجأ العجزة.

**تەکیەگا/** تكية الدراويش.

**تەکیینەوە/** تَجَنُّبْ، إجتناب، تفادي، إبتعاد، تَهرب، تَمَلُص.

**تەگبیـیر/** خطَّة، حيلة، مشروع، مؤامرة، مكيدة، تدبير، تفاهم.

**تەگبیر کردن/** تصميم خطة، تدبير مكيدة، إتفاق وتخطيط لعمل ما، القيام بمؤامرة.

**تەگە = تگە.**

**تەگەرە/** عرقلة، عائق، عقبة، مانِع، مشكلة – عجلة العربة.





**تەگەرە تێ خستن/** إعاقة، تعويق، تعطيل، عوق، إحداث عرقلة.

**تەگەرە تێ کەوتن/** تَعَرْقُل، عَوْق.

**تەگەرە دان/** إعاقة، إحداث عرقلة، عَوق.

**تەگەرە لێدان = تەگەرەدان.**

**تەگەگرتن = تگەگرتن.**

**تەل/** سلك – خَبَر، إشاعة – برقية، تلغراف.

**– ی دڕکاوی/** السلك الشائك.

**تەلار/** شرفة، مقصورة، بَلكون.

**تەلار بەند/** عمارة.

**تەلاش/** جُهد، مسعى، حركة، مجهود.

**تەلاش کردن/** دأب، بذل الجهد، كفاح، إجتهاد، لجاجة.

**تەلان/** مدرجات الجبل.

**تەلان = تەبارە**

**تەلان تەلان/** مُدَرَّج، مخطط.

**تەلانترە، تەلانتەرە/** عشب ربيعي بري.

**تەلبەند/** مُسَيَّج، سياج سلكي، سياج من السلك الشائك.

**تەلچی/** عامل البَرْق، مُبْرِق.

**تەلخانە/** دائرة البرق.

**تەلسز/** لاسلكي.

**تەلەبەرد/** لوح من الحجر.

**تەلەسمە/** ديدان الحُمُصّ.

**تەلەفۆن/** هاتف، تلفون.

**تەلەفـۆن کـردن/** التكلم والمخابرة بالهاتف أو عن طريق الهاتف.

**تەلیسم/** سِحر، شَعْوَذة، طلسم.

**تەلیسماوی/** مسحور.

**تەلیسمباز/** ساحر، سحار، مُشَعوِذ.

**تەلییس/** كيس، خرج، غرارة مصنوعة من الكتان او القنَّب.

**تەلا/** ذَهب، تِبْر عُسْجَد.

**تەلاش/** مَسْح الخشب، نِشارة أو نِجارة الخشب.

**تەلاق/** طلاق.

**تەلاقدان/** تطليق، طلاق، إنفصال، فصل.

**تەلاقدراو/** طالق، طالقة، مُطَلقة.

**تەڵخ/** لون مُعتم، أسمَر، أغبر، مائل إلى السمرة، غامق، قاتم. «مغَوَش».

**تەڵقین = تلقین.**

**تەڵقین خوێندن/** قراءة التلقين على قبر الميت أثنا دفنه وبعد دفنه مباشرة.

**تەڵمـیـیت/** حصان مُجَهَّز بِعُدَّة المتوفي (ملابس وأسلحة) أثناء أخذهُ للدفن.

**تەڵە/** فَخّ، شَرْك، مصيدة، مكيدة.

**تەڵەب/** طلب، مُطالبة، إلتماس، سؤال، إستفهام، حاجة – دور الشُبَق في أنثى الدواب (الفرس والمطي).

**تەڵەب کار/** راغب في، مشتاق أو متشوق إلى، طالب، سائل.

**تەڵەتەقێن/** حَيّال، مُشاغب، غَشّاش.

**تەڵەزگە/** مأزق – مكان زلق و وعر، خَطَر.

**تەڵەزم/** شَظِيَّة، بُراية.

**تەڵەکە/** حيلة، غش، خداع.

**تەڵەکەباز/** حيال، غَشّاش، مُخادع، مُدَبر مكائد.

**تەڵەکەبازی/** تَحايُل، غش، خداع، خِدعَة، خُدْعَة، حيلة، مخادَعَة.

**تەڵەمشک/** مصيدة الفئران، فخ، شرك.

**تەڵەمشکێنە/** لعبة شعبية، لُعبة اليَدَس، لعبة كسر عظم ترقوة الدجاج (عظم إليدس).

**تەڵەمەشکێنە = تەڵەمشکێنە.**

**تەڵەنانەوە/** نصب المصيدة أو الفخ أو الشرك.

**تەم/** ضباب، طَلّ، سديم، غشاوة – هم، غم، قهر، حزن.

**تەما/** أمَل، تَمَنٍّ، قصد، غرض، عزم، مرام، نيَّة، هدف.

**تەماتە/** طماطة، ثمر ونبات الطماطة.

**تەمادار/** مُتَأمِل.
**تەمار/** عَصَب، عرق.
**تەماشا/** رؤية، نَظر، نظرة.
**تەماشاخانە/** مَعْرَض.
**تەماشاکردن/** تَطَلُع، مُشاهدةَ تَمَعُن، النظر إلى، تفتيش، فحص.
**تەماشەوان/** مُشاهد، مُتَطلِع.
**تەماڵ/** تحديد مكان الفريسة.
**تەمباڵ/** دُردُور، دوّامة ماء، موضع مخيف في الماء.
**تەمبەڵ = تەمەڵ.**
**تەمبەڵخانە = تەمەڵخانە.**
**تەم تەم/** أرض صخرية رخوة، صُخور هَشَّة مُتَفَتِتَة.
**تەم تەمە/** مِسْمار المصراع أو الدَوامة.
**تەمراندن/** إطفاء، إخماد، تغطية.
**تەمشو = تەشوێ.**
**تەموخ، تەموخ/** حَجْر رَخوُ، سجِّيل، حجارة كالطين اليابس، طُفال.
**تەمومژ/** ضباب، طلّ، سديم، غموض، هميمة، مطر دقيق القطر.
**تەموو/** محرك ومحور المطحنة المائية.
**تەموورە/** طُنبُور، نَوْع من القيثارة، آلة موسيقية.
**تەموورەژەن/** عازف القيثار.
**تەموورەژەندن/** العزف على آلة القيثار.
**تەموورە لێدان = تەموورەژەندن.**
**تەمەڵ/** كسلان، حيوان يشبه القرد، متوان.
**تەمەڵخانە/** دار العجزة.
**تەمەڵە/** أساس الجدار.
**تەمەڵی/** كسل، توان تَراخ، فتور.
**تەمەڵییت/** خُرج يُشَدَ خَلْف الخَيّال.
**تەمەن/** عمر، سنّ.
**- ی پێگەیشتن/** سن البلوغ.
**- ی درێژ/** العمر المديد.
**- ی لاوی/** ربيع العمر.
**تەمەنا/** سلام، تَحيّة.
**تەمەنا کردن/** تحية، أداء التحية، أخذ سلام.
**تەمەنا کێشان/** أداء ألتحية، أخذ سلام.
**تەمەن پێگەیشتوو/** بالغ سنّ الرشد.
**تەمێ/** نصيحة، عِظة، تَحذير، تنبيه، إنذار، لوم، دَرْس، شورة.
**تەمێ بوون/** تَأدُب، أخذ العِظة والنصيحة، أخذ دَرْس وعبرة.
**تەمێ خواردن = تەمێ بوون.**
**تەمێ کردن/** تأديب، تنبيه، إرشاد، إعطاء النصيحة والدرس.
**تەمیان = تەمیین.**
**تەمییز/** نظيف، نقي، طاهر.
**تەمییز راگرتن/** المحافظة على نظافة الشيء.
**تەمیین/** مهموم، مقهور، قلق، كئيب، شجي، حزين.
**تەن/** بَدَن، جسم، جَسَدْ - سخام، سِناج، كَتَن، لَطْخ الدخان بالحائط.
**تەنا/** وحيد، فريد، منفرد بنفسه، فقط، لاغير - مرتاح، مطمئن.
**تەناف/** حَبْل، حبل الملابس المغسولة.
**- ی شەیتان/** ريق الشمس، مخاط الشيطان، سهام.
**تەناف باز/** بهلوان، اللاعب على الحبل.
**تەناف بازی/** بهلوانية، اللعب على الحبل.
**تەنانەت/** حتى ولوأن، كذلك، أيضاً.
**تەنانی/** جسدي، جسماني.
**تەنایی/** إنفراد، وحدة، عزلة، حِدَة، تَوَحد، وَحْشَة، خُلْوَة.
**تەنبوو/** حشرة القراد.
**تەنپەروەر/** مُحب نفسه، حب الذات، أنانية، إستئثار.
**تەنتەنە/** عَظَمَة، أبهة، فَخْفَخَة، موكب معظم.





**تەندار/** مجسم، ضخم، جثيث، ذوجسد، مُتجسد.
**تەندروست/** معافى، جيد الصحة، سليم البنية، صَحيح، حميد، سليم العافية.
**تەندروستی/** صِحَّة عافية، نَخْب، قوة الجسم.
**تەندوور = تەنوور.**
**تەنشت/** جانب، جَنْب.
**تەنک/** خفيف، رقيق، قليل السَمك - ضَحْل، قليل الغور، سطحى، قليل العمق.
**تەنکاو/** ضحل، قليل العمق، قليل الغور.
**تەنکایی/** الجزء الخفيف أو الرقيق.
**تەنک بوون/** تخفيف تلقائياً.
**تەنک کردن/** تخفيف، جعل المكان أو الشيء خفيفاً أو رقيقاً.
**تەنک و تیپوال/** رقيق، خفيف، قليل السَمك.
**تەنکە/** سَمك الزبيدي.
**تەنکە کردن/** تخفيف وقلع النباتات الزائدة.
**تەنکە ماسی/** سَمك الزبيدي.
**تەنکە باخەڵ/** كناية عن وضع الشيء في الجيب بأمان، (**خستنە تەنکەی باخەڵەوە**).
**تەنکەی گیرفان = تەنکە باخەڵ.**
**تەنگ/** ضَيّق، مَشدود، مطبوق - ممر ضَيق - حزام النقود - خصر، كرش.
**تەنگانە/** حَرَج، مأزق، شدائد، شدّة، ضِيق، بنات الدهر، وقت الضرورة والضيق.
**تەنگاو/** متضايق، مضطرب، منزعج، مُحْرَج - محصور البطن.
**تەنگاوبوون/** تضايق، في مأزق، إضطراب، إنزعاج، تضايق ومحصورية، وقوع في مأزق واضطراب.
**تەنگاوکردن/** تضييق، حَصر، إيقاع في مأزق.
**تەنگایی/** مكان ضيِّق، ممر ضَيِّق، مكان محصور، مضيق.
**تەنگ پێ هەڵچنین/** تضييق، مضايقة، ضغط، تعقيب وملاحقة.
**تەنگ دەست/** فقير، محتاج، مُعْوَز، مسكين.
**تەنگ دەستی/** فقر، حاجَة، عَوَز.
**تەنگز/** شجيرة شائكة.
**تەنگ و چەڵەمە/** مأزق، مُشكِلَة، عائق، عَرقَلة، أزمة، شدّة، ضِيق، عُسر، فوضى، إضطراب، مُعضلة.
**تەنگە/** حِزام السرج، حياصة أو حزام منسوج، إكاد، سَيْر يشد به السرج.
**تەنگەبەر/** مكان ضيق، مضيق( **بوغاز**).
**تەنگەتاو/** مضطرب، منزعج، متضايق - محصور البطن، متضايق ومحتبس البول.
**تەنگەتاوکردن/** حصر، إزعاج، تضييق، ضغط ومضايقة.
**تەنگە تیلکە/** حاد الطبع، سريع التهيج، عصبي، مضطرب، مُنْفَعِل.
**تەنگەدان/** شد الحزام، شَدّ حزام السرج أو الحياصة.
**تەنگە شل کردن/** حل أو فك أو إرخاء الحزام.
**تەنگە کێشان = تەنگەدان.**
**تەنگەگر/** الحزام المؤذي للخاصرة- الكلام المارح.
**تەنگەگرتن/** إنفعال، تهيج، تأثر، تضايق.
**تەنگەڵان/** مكان ضَيِّق، مَضيق.
**تەنگە نەفەس/** ضَيِّقْ النَفَس.
**تەنگە نەفەسی/** ضيق النفس.
**تەنگی/** ضيق، حَرَج، حُزن، غم، مأزق، تَوَتُر، صُعُوبة، مشكلة، مُعْضلة، إختناق.
**تەنگییژە/** إختناق، مأزق، صعوبة، معضلة.
**تەنۆکە/** جُسَيمَة.
**تەنوا/** وَسخ، قَذر، دَنس.
**تەنوایی/** وساخة، قذارة، دَنَس.
**تەنولکە/** جُسَيمَة.
**تەنوور/** تَنّور، فرن، مَخْبز، وطيس.
**تەنوور داخستن/** إشعال النار في التَنور، إحماء وتسخين التنور.
**تەنوور شێوێن/** محراك النار، مسعر، مجْهَل، مِجْهَلَة، أسطام، عود تُحَرَك بها النار، جَيْهَل.

**تەنوورە/** القسم الأسفل من المطحنة المائية – تنورة، النصف الأسفل من الثوب، طوق.
**تەنوورەدان/** تطويق، إحاطة، حصر – تَكَوُّم.
**تەنها/** وحيد، فريد، منفرد بنفسه، لَيْسَ إلاّ، فَقَط لاغير.
**تەنهایی/** إنفراد، وحدة، عُزلة، حِدَة، تَوَحُد، وَحْشَة، خُلوة.
**تەنە/** جذع، ساق، بَدَن، جسم، جذل.
**تەنەکە/** تَنَكة، عُلبة، صفيح، صفيحة، قصدير.
**تەنەکەچی/** سمكري، تنكاري.
**تەنەکەساز = تەنەکەچی.**
**تەنێ = تەنها.**
**تەنی/** سخام، سناج، هباب المصباح، دُخان، كَتَن، لُطَخ الدخان على الحائط – خفيف، رقيق.
**تەنیا = تەنها.**
**تەنیا باڵ/** وحيد، بدون مساعد، بلا معين.
**تەنیایی = تەنهایی.**
**تەنیشت/** جَنْب، جانب.
**تەنیشت یەک/** بجانب، الواحد بجانب الآخر.
**تەنین/** حياكة، نسج – رصف، سَدّ.
**تەنییەنەوە/** إنتشار، توسع، إتساع، بسط، رَيّان، عدوى فرش، إمتداد، مَدّ.
**تەو/** غنم ذات الوجه الأسمر أو البني الداكن.
**تەوا/** نيَّة، عزم، قَصْد، مرام، أمل.
**تەوات/** صبر، تَحْمُل، تأن.
**تەواتیر/** إشاعة، أقاويل.
**تەوادار/** متأمل.
**تەوار/** أصل مصدر – أنثى الباز – صغار الحيوانات المُنْتَعشَة.
**تەوازو/** طَلب السماح والعفو.
**تەوازێ/** إعتذار.
**تەواسان/** يأس، قطع الأمل والرجاء، كسر العزيمة والرغبة.
**تەواسیان/** يأس، قُنوط، تردد.
**تەواش/** سَمْن، دهن.
**تەواشا = تەماشا.**
**تەوانا = توانا.**
**تەواو/** تام، مُنْجَز، مُنْتَه، إنتهى، إنتهاء، كامل.
**تەواوبوون/** إنتهاء، إكمال، إتمام، إنجاز.
**تەواوکاری/** التكامل.
**تەواوکردن/** إنهاء، نَهو، إكمال، إتمام، إنجاز، قضاء.
**تەواوکەر/** المُتَّمم، المتُممَة، تكملة، مُكَمل.
**– ی سەر بەخۆ/** المتمم المباشر.
**– ی یاریدەدەر/** المتمم غير المباشر.
**تەواوەتی/** تماماً، كليةً، مضبوط.
**تەواوی = تەواوەتی.**
**تەوخ/** إسطبل شتوي تحت الأرض أو في السرداب.
**تەور/** طبر، بلطة، قَدُّوم، فأس.
**تەوراس/** فأس، آلة قطع الخشب، ساطور منحني، مِعْضَد.
**تەورداس = تەوراس.**
**تەورزین/** طُبْر، طبرزين، فأس، مِعْضَد، حديدة كالمنجل لقطع الخشب.
**تەورک/** بَلّور.
**تەورک بوون/** تَبَلْوُر.
**تەورێزی/** صنف من العنب.
**تەوزە/** هزء، سخرية، هزاء.
**تەوزە پێ کردن/** إستهزاء، تهكم، إستخفاف بالآخر.
**تەوزیم/** إلزام، إجبار، واجب، ضرورة.
**تەوژم/** قوَّة.
**تەوس/** إستهزاء، إستخفاف، سخرية، إستهانة، إحتقار، لُغز.
**تەوشو = تەشوێ.**
**تەوق/** طوق معدني – قمة، رأس، ذروة.
**تەوقە/** ماشة الشعر – مُصافَحَة.
**تەوقەسەر/** قمة الرأس، يافوخ، هامة الرأس.





**تەوقەکردن/** مصافحة.
**تەوقە گوڵ/** إكليل من الزهور.
**تەومان/** سروال، اللباس التحتاني.
**تەون/** نسيج، نَول، منْول، مِنسَج.
**تەون چنین/** حياكة، نَسْج.
**تەون کردن = تەون چنین.**
**تەوور/** قُطب.
**– ی باشوور/** القطب الجنوبي.
**– ی باکوور/** القطب الشمالي.
**تەووژم/** قوَّة، عُنف، ضَغْط، شِدَّة، قَسوة، تيّار، زخم، تَدَفُق، إندفاع.
**– ی خوێن/** ضغط الدَم.
**تەووژم هێنان/** إندفاع هجوم، إقتحام.
**تەوەرگ/** حالوب، بَرَد.
**تەوەرە/** مركز الثقل – محور، مَدار، مِشَد – خشبة في المطحنة المائية – أحداثية.
**تەوەرە ئاسۆییەکان/** الأحْداثيات الأفقية.
**تەوەزەل/** خامل، كسلان، كسول، متوان، لايشتغل، بدون شغل و عمل، خُدام.
**تەوەزەلی/** خمول، كَسَل، توان، تراخ، فتور، بطالة.
**تەوەس/** تَبْغ ناعم وحادّ.
**تەوەق = تەبەق.**
**تەوەل/** متشرد، متسكع، زَمعي، خسيس، عَيّار.
**تەوەن/** حَجَر، صَخر.
**تەوەن تاش/** نَقّار الحجر.
**تەوەنە/** كَوْم.
**تەوەنەدان/** تجميع، تكويم، كَوْم.
**تەوێڵ/** جبين، جبهة.
**تەوییلە/** إسطبل، إصطبل.
**تەی/** غنم أبيض – أليف، أنيس، داجن – حركة، تَحَرُك.
**تەی کردن/** تفتيش، تَحَري، تقصي، رواح و مجيء.
**تەیار/** مستعد، متأهب، حاضر، مهيأ، جاهز – معارض.
**تەیان/** خادمة، شغالة، مُرَبيَة.
**تەیچە/** سَلَّة.
**تەیس/** لمعة، بصيص، بريق، برق.
**تەیسان/** لمعان، إضاءة.
**تەیکە/** طبق، سَلَّة مُسَطَّحَة.
**تەیمان/** سياج، سياج أو حاجز من أغصان مصنْفورة.
**تێ/** في، من، إلى، نحو، حول – حُمّى، سخونَة.
**تێ ئاخنین/** حشو، حَشر، إدخال، سَدّ فتحة وثقب.
**تێ ئاژنین/** نَخْس، نَخْز.
**تێ ئالان/** شبك، إلتفاف.
**تێ ئالاندن/** تغليف، لَفّ، إحتبال.
**تێ بردن/** إدخال، حشو، تثبيت.
**تێ برین/** إدخال، تثبيت – تطلع أو تفرس في، النظر بدقة، حَمْلَقَة.
**تێ بەربوون/** بَلْش، شُروع بـ، تَهَجُم، مهاجمة.
**تێ بەردان/** تَحريض، تَهييج، إطلاق وفك صغار الغنم والماعز مع الامهات للرضاعة، إطلاق وفك الذكور مع النشايا للتسفيد، تحريض وتهيج شخص أو كلب على آخرين.
**تێ بیین/** حريص، متحذر، حذر، محترس، متفكر، ملاحظ.
**تێ بینەر/** ملاحظ.
**تێ بینی/** ملاحظة، تَرَوِّي، تفكير، تَفَكُر، إمعان النظر، إحتراس، حيطة، تأمل.
**تێ بینین/** تمعن النظر، تفكر، تروي.
**تێ پەڕ/** ماضٍ، ماضي، مجتاز، عابر، مُغادر، متعدي.
**تێ پەڕاندن/** تعبير، تمرير، خرق، إمرار وقت.
**تێ پەڕیو/** مجتاز، عابر، مُغادر، غابر، سالف، فايت، مار، المار ذكره.
**تێ پەڕبوون/** إجتياز، عبور، مضي، مرور، مغادرة، إختراق، فوات.
**تێ پەڕکردن/** إجتياز، عبور، مغادرة، مرور، إمرار.

**تێ پەڕکەر/** مُعَبِّر، مُتَعَدي، القائم بالإدخال.
**تێ پەڕین = تێپەڕبوون.**
**تێ پەڕییو = تێ پەڕبوو.**
**تێ پەستان = تێ ئاخنین.**
**تێ پێچـان/** لَفّ شيء على شيء آخـر، تضـيـيـق، إزعاج.
**تێ ترنجان/** حشر، حصر، عصيان، حصر شيء بين طيات شيء آخر.
**تێ ترنجاندن/** إدخال، حشر، تثبيت، كبس.
**تێ تراندن/** أكل بشراهة و بكثرة، شراهة، نَهْم.
**تێ قلیسک/** عشب مائي.
**تێ تەقـان/** إنهـزام، هزيمة، ركض، إبتـعـاد، هروب، فرار.
**تێ چاندن/** مـشـاغـبـة، تلفـيق، التكلم بسـوء في الخفاء، الحَطّ من القيمة، ذَمّ.
**تێ چریکان/** زعيق، صراخ، غناء، البدء والشروع بالغناء وبصوت عال.
**تێ چڕان/** تجمهر، تجمع، تحشد.
**تێ چوون/** دخول، ولوج، وَخز، خرق - تكليف، بلوغ التكاليف والأجر.
**تێ چەسپان/** دخول، حشر، تثبيت.
**تێ چەسپاندن/** إدخال، حشر، تثبيت.
**تێ چەسپین = تێچەسپان.**
**تێ چەقان/** نَبْت، دخول، وخز.
**تێ چەقاندن/** إنبات، إدخال، وَخز، طعن، غَرز.
**تێ چەقین/** تێچەقان.
**تێ چێن/** مُشاغِب، مُلفق، مُشَوه السمعة، المتكلم بالسوء.
**تێ خزان/** حشر، تزاحم، الدخول في الزحام حشكاً.
**تێ خزاندن/** حَشر، إدخال، تثبيت.
**تێ خزین = تێ خزان.**
**تێ خستن/** إدخـال، إيلاج، حَشـر - قَـهـر، التـغلب على، إيقاع.
**تێ خـسـتنەوە/** إدخـال وتحـشـيـة ثانيـة، التـغلب والسيطرة مرة أخرى.
**تێ خـوڕین/** تنبـيـه وإنذار بَزجـر وعُنْف - سـوق الدواب.
**تێدا/** فيه، في الداخل.
**تێدابوون/** إحتواء، تواجد، إكتفاء، كفاية.
**تێداچوون/** فشل، رسوب، إفلاس، خسارة، فقدان.
**تێداچەقین/** طمس، طمر في.
**تێدارامـان/** تَمَعُن، تَرَوُي، تفكير، تـفكير بامـعـان النظر.
**تێداشکان/** إحباط وفشل، إفلاس، إنهيار، تقهقر.
**تێداکردن/** إكتفاء، جعل الشيء كافياً ولا ينقص.
**تێ دامان/** حيرة، تحير، إرتباك - بقاء الشيء وعَدم إنتهائهُ.
**تێ دان/** إصابه بمرض أو حشرة - إضافة قـماش، تطويل او تعريض قماش أو ملابس.
**تێ دانەوە/** إضافة، إلحاق.
**تێـر/** مُـشْـبع، شـبـعـان، ممتليء، طافح، مـكظوظ، الممتليء من الطعام - ظلمة، عتـمة، مظلم - لون قاتم، غامق،.
**تێـرئاو/** مَـسْـقي، مـروي جـيـداً، شَـبـعـان، نقـيض عطشان.
**تێراو = تێرئاو**
**تێربوون/** تَشَبُع، شبع، إشباع، إكتفاء.
**تێرخواردن/** تناول الطعام لغاية الشبع، إشباع.
**تێرکردن/** إشباع، إملاء.
**تێرنەخۆر/** مبْطان، نَهْم - حيوان يشبه القرد.
**تێروپڕ/** شبعان، ممتليء، طافح، مُفْعَم.
**تێروتەسەل/** شبعان - غني، مُتَمَكن، مرتاح.
**تێروو/** الحيوانات المفترسة الوحشية - إسم شجرة.
**تێره خۆر(ە)/** شُبْعَة، قَدر مايُشبع مَرّة، كفاية، وجبة واحدة من الطعام، الطعام الكافي للشبع.
**تێرێتی/** شِبْع، إمتلاء، إكتظاظ، كَظّة.





**تێریی = تێرێتی.**
**تێڕ/** كيس، جراب، عدل - كمية من الغائط.
**تێ ڕادان/** غسل، شطف، خض الإناء بالماء.
**تێ ڕامان/** إستـبطان، تأمُل، تَرَوي، تـفكير، تَفَكُر، التأمل الذاتي.
**تێرتێرە/** حرباء، من الزواحف.
**تێ ڕژان/** تدفق إلى، يَنْصَبُ في، يَنْسَكِبُ إلى - إختلاط، تجمهر.
**تێڕک/** كيس، جراب، عدل، خُرج.
**تێ ڕوانیین/** تَفَرُس، مـعـاينة، حـملقـة، النظر إلى شيء مـا بدقـة وإمـعـان النظر، تَمَـعُن، تروي، تفحص.
**تێ ڕوانێتی/** فكرة، نظرة، وجهة نظر.
**تێز/** إسـتـعـداد، تأهب - فـتـحة الإطلاق في بعض البنادق، فتيل المفرقعات.
**تێزاب/** حامض النتريك، ماء الفضة.
**تێ زان/** تميع، إحتقان، تجمع ماء.
**تێز پێ کردن/** إستهزاء، هَزء، سخرية.
**تێزکردن/** تحضير، تهيئة، تعمير، تحضير البندقية.
**تێـزە/** نصل الرمح - فـتـحـة الاطلاق في بعض البنادق.
**تێژ/** حاد، سريع، تاقب، قاطع، صارم.
**تێژک/** صغار الحيوانات المفترسة.
**تێساو/** حجر السَنّ.
**تێساوین/** تدهين.
**تێ سـرەواندن/** ضـرب، توجـيـه الضـربة، الضـرب الفجائي.
**تێسکە/** فتيل المفرقعات.
**- ی تفـەنگ/** شـرارة أو إطلاقة البندقـيـة، فـتـحـة التفجير في الاسلحة التي تُحَشَّى.
**تێ سوون/** تدهين، تدليك، طلاء، تغطية.
**تێشت/** طعام، أكل، فطور، غداء.
**تێ شکان/** فَشَل، إفلاس، رسوب، عجز، إندحار، نَكسة، خيبة.
**تێ شکاو/** مُنْدَحر، مُنتَكِس، مـصاب بـالإفـلاس أو خسارة أو مرَض أو مصيبة.
**تێـشـوو/** طعـام يجـهـز للطريق والسـفـر، مـؤنة، إحتياط، مستقبل.
**تێـشـووبەرە/** مِزوَد، وعـاء أو قـمـاش يوضع فـيـه الطعام.
**تێشوودان = تێشووبەرە.**
**تێشووکردن/** عمل طعام السفر، تناول الفطور.
**تێ شیشان/** المباشرة السريعة في عمل ما لإنجازه.
**تێ فڕێدان/** رمي أو إلقاء أو إدخال في.
**تێ فکرین/** إمـعـان النظر، تَرَوي، تَفَكُر، تدقـيق النظر.
**تێ قرنجان/** حشر، حشك، دخول، إدخال.
**تێ قلْپاندن/** سكب مادة في سائل.
**تێ قوپان/** تجعد، تكرش.
**تێ قوپاو/** مُجَعَد، ضعيف، هزيل.
**تێک/** عظم الفخذ.
**تێک ئاڵان/** تشابُك، ضَفر.
**تێک بەربوون/** إشتباك، مصارعة، تلازم، وتشابك، للمصارعة والشجار، إقتتال، عراك، مشاجرة.
**تێک بەردان/** تحريض، تحـريض وخلَط مجـاميـع مع بعضها.
**تێک پەڕاندن/** إجتـيـاز، عَـبْر، تعـبـير، إدخـال من طرف واخراج من الطرف الآخر.
**تێک پەڕین/** عبور، عبور وإجتياز شيئين متقابلين
**تێک ترنجان/** تلاصق، حشك، تشابك.
**تێک چوون/** حـدوث سـوء تفـاهم، حـدوث خلل، عـراك، خصـام، خراب، تفليش، هدم - خلل عقلي.
**تێک خران/** حشك وجمع أشياء مع بعضها.
**تێک خزان/** حشك، تشابك، تلاصق.
**تێک خستن/** إدخال، جمع، لم، ضَمّ.
**تێک دان/** تخريب، تفليش، تدمير، إتلاف.
**تێک دراو/** مُدَمَّر، مُفَلَّش، مُخَرَّب.

**تێک دەر/** مُخَرِب، مُدَمر، مَهَدِم.

**تێ کردن/** صب، کب، سَکب.

**تێکڕا/** معاً، جميعاً، عموماً، جملة، معدل، على العموم، إجمالاً بوجه الإجمال، على وجه عام، مطلقاً، إطلاقاً.

**– ی ژمێرەیی/** المعدل الحسابي.

**– ی ساڵانە/** المعدل السنوي.

**تێکڕایی/** بالاجمال، بإتحاد الاراء، إجمالي، عمومي.

**تێکست/** نص، نص أدبي.

**تێک سمران/** تضخم، ضخامة، جسامة.

**تێک سمراو/** ضليع، ضخم، جسيم، مربوع القائمة، رضراض، كثير اللحم، كنيز، مكتنز.

**تێک شکان/** تقهقر إندحار، فشل، تكسر، تحطيم.

**تێک شکاندن/** دَحر، كسر، تحطيم.

**تێک شکاو/** مُندَحر، فاشِل، مكسور، مُحَطَم.

**تێک گییران/** تشابك.

**تێ کۆشان/** كَد، كدح، كفاح، إجتهاد، نضال، سعي، بذل الجهد، دأب، عمل.

**تێ کۆشەر/** مناضل، مجاهد، مكافح، كدود، كادح، مجتهد، دؤوب، مثابر، مجد، ساعي.

**تێ کۆشین = تێ کۆشان.**

**تێک و پەکان/** مُدَمَر، مُخَرَب، مهدم، تالف.

**تێک و پەکاندان/** إتلاف، تدمير، إبادة، تخريب كلّي.

**تێ کوتان/** إدخال، حشر.

**تێک هەڵچوون/** تشابك، عراك، حدوث، سوء تفاهم.

**تێک هەڵدان/** تحريك، تقليب، رَجّ.

**تێک هەڵشێلان/** عَجْن، تحريك.

**تێ هەڵکێش/** متشابك، متداخل.

**تێ هەڵکێشان/** إدخال، شبك.

**تێکەڵ/** محلول، مزيج، خليط.

**تێکەڵاو/** ممزوج، مركب، خليط.

**تێکەڵاوبوون/** مزج، أو خلط تلقائياً.

**تێکەڵاوکردن/** مزج، خلط.

**تێکەڵاوی/** إختلاط، تبادل الزيارات، محبة، مودة، ألفة، صداقة، صُحبَة، مخالطة، عِشرة، مُعاشرة.

**تێکەڵ بوون = تێکەڵاوبوون.**

**تێکەڵ دان/** مزج، خلط.

**تێکەڵ کار/** خلاطة.

**تێکەڵ کراو/** خليط، مخلوط.

**تێکەڵ کردن = تێکەڵاوکردن.**

**تێکەڵ و پێکەڵ/** مخربط، مُشَوَّش، غير منتظم، فَوضى.

**تێکەڵە/** خليط من الحصو والرمل، مخلوط، ممزوج.

**تێکەڵی = تێکەڵاوی.**

**تێ کەوتن/** فَشل أو رسوب أو سقوط في عمل، تقهقر، تأخر، تورط – غطس، سبح، وقوع وسقوط في الماء.

**تێکە و لێکە/** فوضى، أنعدام النظام، كل لنفسه.

**تێ گرتن/** رَمي، رَشق، طرح، قذف، تسديد – تغليف، عمل إطار للصورة – تلويث ولطخ بالحناء، وضع الحناء على اليد والرأس، وضع عجين وبعض مسكنات الآلام على الجسم.

**تێ گوشین/** ثَرد، ثَرد الخبز في المرق – تبذير، إسراف.

**تێ گەیاندن/** تعليم، تفهيم، إيضاح، توضيح، تلقين، تفسير.

**تێ گەیشتن/** تفهم، تعلم، فَهم، إدراك، حِذق، حَذاقة، دراية، فطنة.

**تێ گەیشتوو/** متعلم، فاهم، فهيم، عاقل، ذكي، حاذق، ماهر، مدرك، مثقف، علاّم، علامة، كثير العلم والمعرفة.

**تێ گەیین = تێ گەیشتن.**

**تێ گەییوو = تێ گەیشتوو.**

**تێ گییر/** مشكلة، مُعضِلة.





**تێ گییران/** حَشر، توقف وحصر شيء بداخل شيء آخر، حيرة، دخول في ورطة.

**تێ گییر کردن/** حَشر، تثبيت، إدخال شيء لأجل التثبيت.

**تێلا/** عصا، عصا غليظة، دعامة.

**تێلا ترێن/** الضرب المؤذي، ضرب بعَصَا غليظة.

**تێ مان/** حيرة، تَحَيُر، إرتباك.

**تێ ماو/** متحير، مرتبك، بائس.

**تێ مرووکان/** تطويق، محاصرة، تجمع وتراكم على.

**تێ مۆڕبوونەوە/** تَفَرُس، حَملَقَة، تَجَهُم.

**تێمیسک = تامیسک.**

**تێنان/** خسارة، فقدان، دمج، إدماج، حشر، إدخال.

**تێ نواڕین/** تَفَرُس، النظر إلى شيء ما بدقة، حملقة.

**تێ نەپەڕ/** غير عابر/ اللازم، زمن المضارع.

**تێ نووین/** المحاولة لحمل شيء ما أو القيام بعمل.

**تێ نیشتن/** مُشاركة، القيام بعمل بقوة وعزم.

**تێ وردبوونەوە/** تَفَرُس، تَطَلُع، النظر إلى شيء ما بدقة.

**تێ ورووژان/** تطويق، إحاطة، إثارة.

**تێ ورووکان/** تطويق، إحاطة، تهيج.

**تیۆری/** نظرية.

**تێ وشین = تێ گوشین.**

**تێوە/** حول، في.

**تێوە ئاڵان/** لَفّ، عصب، ضمد، لَف حَول.

**تێوە پێچان/** لَفْ، عصب، ضمد، تغليف، دَثر، حَبَك.

**تێوەچوون/** تَلَوث، تَلَطخ.

**تێوەدان/** إضافة، دمج، تلويث، تلطيخ.

**تێ وەردان/** شطف، خض، غسل، غسل وخض الإناء بالماء، مَضْمَضة، رَحْض الشيء بَرجه بالماء أو رج الماء فيه.

**تێوەژاندن/** نَخْز أو نَخْس الدابَة، نَخْز، نَخْس.

**تێوەژەندن = تێوەژاندن.**

**تێوەژەنین = تێوەژاندن.**

**تێ وەشاندن/** هَزّ الملابس داخل التنور، تفريغ.

**تێوەگلان/** تَوَرُط، الوقوع في ورطة.

**تێوەگلاندن/** توريط شخص في مشكلة أو في قضية أو عمل.

**تێ هاتن/** مجيء، سريان وتَسَرُب إلى.

**تێ هانین/** نجاح، توفيق، إنتصار.

**تێ هەڵچوون/** مُشاركة، البدء في، الدخول في، تَدخُل في.

**تێ هەڵچوونەوە/** إستئناف، البدء من جديد.

**تێ هەڵدان/** ضرب، رفس، ضرب بالرجل – التخلي عن هجر.

**تێ هەڵسوون/** تدهين، تدليك، تغطية، طلاء.

**تێ هەڵقورتان/** تَدَخُل، تَطَفُل، تدخل بلا أستئذان.

**تێ هەڵقوڵتان = تێ هەڵقورتان.**

**تێ هەڵکێش/** متفاوت، متداخل، مداخلة، تلبيس.

**تێ هەڵکێشان/** غَمْر، طمس، إدخال وطَمْس في الماء واخراجه – تعبير، تشابك، تداخل، إلباس، تلبيس.

**تێ هێنان/** نجاح، توفيق، إنتصار.

**تیا = تێدا.**

**تیابوون = تێدابوون.**

**تیاترۆ/** ملهى، مرقص، راقصة.

**تیاترۆخانە/** ملهى، مرقص. كبريه.

**تیاچوون = تێداچوون.**

**تیاچەقین = تێداچەقین.**

**تیاڕامان = تێداڕامان.**

**تیاشکان = تێداشکان.**

**تیاکردن = تێداکردن.**

**تیامان = تێدامان.**

**تیاماو/** حائر، دَجر، دَجران.

**تیان/** قدر أو جدر الحمام، قدر كبير لعمل الحلويات.

**تیانچە/** بَوْدَقة، قدر أو جدر صغير.

**تيانووس/** دفتر، ورق، كاغد، مايكتب عليه.

**تيانه = تيان.**

**تيتله و بيبيله/** عنوان وأسماء ابطال قصة فولكلورية للاطفال.

**تيسک/** شَعر، وَبر، الشعر الطويل.

**تيسكن/** مُشعِر، مُشعِراني، كثير الشعر، أَفْرَع، أَزَبّ.

**تيشک/** شُعاع، شعاعَة، شُعَّة، أشعَّة.

**– ی بن سوور/** الاشعة تحت الحمراء

**– ی خۆر/** عَبء الشمس أي ضوئها، أشعة الشمس.

**– ی رۆژ = تيشكی خۆر.**

**– ی سنگ/** أشعة الصدر.

**– ی سوور/** الأشعة الحمراء.

**– ی گەردوونی/** الأشعة الكونية.

**– ی وەنەوشەيی/** الأشعة البنفسجية.

**تيشكدار/** مُشع.

**تيشكدانەوە/** إشعاع.

**تيشكۆ/** بؤرة.

**تيلم/** قطعة من القماش، وصلة أو قصاصة قماش.

**تيلماسک = تيلم.**

**تيان = تيان.**

**تيانچه = تيانچه.**

**تيپ/** جماعة، فرقة، فريق، زمرة، سرب، رهط، شِلَّة، سريَّة.

**تيپەن/** جماعة من الفرسان.

**تييت/** شَعْر، شعر في جانبي الرأس.

**تيتاڵ/** إستهزاء، هزء، سخرية، هزل.

**تيتاڵ باز/** هزلي، سُخري، مَزّاح.

**تيتاڵی/** حَيّال، ساخر.

**تيتک/** شعر، شعر في جانبي الرأس – جَرو، جرو الكلب – عَمّة، أخت الأب.

**تيتكزا/** إبن أو أبنة العَمَّة.

**تيتلەکه ناچه/** طير النورس، زُمَّج الماء.

**تيتۆڵ/** ملابس قديمة بالية، فضلات وقصاصات الأقمشة.

**تير/** سهم، نَبْلة، نُشّابَة – السواقي المتوازية لسقي الشلب – ثخين القوام.

**تيرئەنداز/** نبّال، رامي السهام والنبال.

**تيراوێ/** جرح الكنكرين.

**تيراوێژ/** مدى رماية السهم، نبّال، رامي السهام.

**تيردان/** غمد النبال والسهام، كنانَة، جُعْبَة من جلد أو خشب تجعل فيها السهام.

**تيرۆر/** إرهاب.

**تيرۆر کردن/** ترهيب، تخويف، فَزع.

**تيرۆرزم/** إرهابي، مُفزِع.

**تيرۆرست/** إرهابي، مُفزع.

**تيرۆژو/** وصلة قماش مثلثة الشكل في جانب الثوب أسفل الذراع.

**تيرۆک/** شَوبَك، شَيْبَك، مَطْلة، مِسْطَح، مِحلاج، مرقاق العجين، مايوسع به العجين وُيرق.

**تير و کەوان/** قوس ونَشّاب.

**تيرهاوێژ/** نبّال، نابل، رامي السهام.

**تيرهاويشتن/** رَمي أو رماية السهام أو النبال.

**تيرە/** عشيرة، طائفة، بطن، عائلة – سير جلدي – قُطر الدائرة.

**نيوە تيرە/** نصف قطر الدائرة.

**تيرە باران/** رماية السهام المستمرة.

**تيرەشان/** شمع العسل.

**تيرەغە/** العمود الفقري.

**تيرەگە/** مُرتَفَع.

**تيرەگەر/** طائفي، متعصب وشوفيني.

**تيرەگەری/** الطائفية، النزعة العشائرية، تَعَصُب، الشوفينية.

**تيرەگەشان/** سطح الجبل.

**تيرەمار/** أفعى سامة، حية صفراء قصيرة وسريعة الجري.

**تيرەی ئاو/** ساقية، جدول، قناة الماء.





**تييرى .. نانی تييرى.**

**تيز/** سخرية، تهكم، تقليد، إستهزاء

**تيزان .. هەڵتيزان**

**تيزانگ/** مثانة، نَفّاخَة.

**تيز پێ کردن/** إستهزاء، سخرية، تهكم، تقليد، تصنيف.

**تيزيپێوەکردن/** بعض، الضرب على الدبر بالاصبع، استهزاء.

**تيژ/** حاد، ماض، ثاقب، قاطع، صارم، مدبب، مُسَن – شَحوذ، شَحيذ، حرِّيف.

**تيژاو/** تيزاب، ماء القلي.

**تيژ باڵ/** سريع الطيران، الطائر السريع في الهواء.

**تيژ بوون/** حَدّ، سَنّ – الحاح، إصرار وتعند، لجاجة.

**تيژڕەو/** سريع، نَفّاذ، سريع الجري.

**تيژڕەوت/** سريع الجري.

**تيژڕەوی/** نَفّاذية، سُرعَة.

**تيژ كردن/** شَحذ، بَري، سَنّ، حَدّ، تحريك، حث، استفزاز.

**تيژی/** شدّة، حدّة، قُوَّة، صَرامَة، مَضاء، جديَّة.

**تيغ/** السِلاح الجارح، شفرة، موس الحلاقة.

**تيغە.. تيغە ديوار/** جدار قليل العرض أو السُمك، قاطع.

**تيغە شان/** سلسلة الجبال.

**تيف/** أملس، ناعم.

**تيفتيفە/** لمعان، بريق الوجه بعد الحلاقة.

**تيفتيفەدان/** تلميع، تدهين وتلميع وتعقيم الوجه بعد الحلاقة.

**تيک/** خياطة، دَرْز.

**تيكە/** لقمة – قطعة، كسرة، هُتَامَة.

**تيكەتيكە/** مُقَطَع، مُجَزأ.

**تيكەتيكە كردن/** تقطيع، تجزأة.

**تيكەگرتن/** عمل اللقمة.

**تيكەگلاندن/** تناول اللقمة بشراهة.

**تيل/** أحول، حولاء، العين المنحرفة عن مركزها الاصلي – دُعْبُل، حركة، الدعبل.

**تيلاک/** أصلع، أجرد الرأس.

**تيلايی/** غَمزة العين، طرفة العين، غَمْز، غَمْزَة.

**تيل كردن/** تحريك الدعبل، تصويب وتوجيه الدعبل إلى الهدف.

**تيلماسک/** قطعة أو وصلة من القماش.

**تيلمه = تيلماسک.**

**تيلێن/** لعبة الدُعبل، اللعب بالدعبل.

**تيم/** جانب، جهة، طرف، ناحية، فِرقَة، فريق، سرب.

**تيمار/** تداوي، علاج – العلف الذي يعطى للحيوان ليلاً – مسحل محكة الخَيل، محسَّة.

**تيمار خانه/** مركز العلاج والتداوي، مستشفى، بيطرة.

**تيمارستان = تيمارخانه.**

**تيمار كردن/** تداوي، تضميد، تمشيط الحيوان.

**تيماركەر/** مضمد، معالج.

**تيمانج/** جلد ناعم مدبوغ، قطعة قماش لتطويل الرداء.

**تين/** طاقة، حرارة، سخونة، حَمُو، حدّة، قوّة، وَقع تأثير، مفعول، شدَّة.

**تينوو/** عطشان، عَاطش، حَرّان، ساهف، صَد، صديان، غليل، مغلول، نَجْران، لائب، هَيوف، مهياف، هيفان، هائف – مُشتاق، راغب.

**تينووبوون/** عَطَش، ظَمأ، تَوق، الشعور بالعطش.

**تينووكردن/** تعطيش.

**تينوويەتی/** عَطَش، ظَمَأ، أوام، سُهاف، قَيْظ، تَوق، إشتياق، رغبة، صَدى، غُلّ، غُلّة، غليل، قيظ، لَوْب، لوُب، نُجَر.

**تينوويی = تينوويەتی.**

**تيوالْ = تەنک و تيوال.**

# ج

**جا/** مكان، موقع، محل.
**جا/** حرف يُعبِّر عن عدم المبالاة في حدوث الفعل، **(جا با بێ)** ليأتي.
**جا/** زمن، وقت، **(كه ئەو نوست ئەوجا من ئەنوم)** بعد ماينام أنام أنا.
**جا/** حتى **(من گردم نەدیبیوه چ جای شاخ)** أنا لم أر التل حتى أرى الجبل.
**جاتره/** صَعْتَر، سَعْتَر، زَعْتَر.
**جاتره كێوییله/** نبات المر، قوش، عُنْصُل.
**جاتەنه = جاڵجاڵۆكه.**
**جاجک/** علك.
**جاجكه تاڵه/** العلك المُرّ، علك نيء، طبيعي غير معامل، خام
**جاجكه خۆشه/** العلك الحلو، علك معامل مع مَواد أخرى.
**جاجم/** شَفّ، بطانية صناعة محلية، دثار صوفي.
**جاچک = جاجك.**
**جاچكه تاڵه = جاجكەتاڵه.**
**جاچكه خۆشه = جاجكه خۆشه.**
**جاخ/** كيس خاص لكبس التبغ - جدار من الخشب - موقد.
**جادوو/** سحر، عرافة، كهانة، شعوذة.
**جادووباز/** ساحرِ، عَرّاف، مُنَجِّم، مُشَعوذ.
**جادووبەن، جادووبەند/** لوح يكتب عليه دعاء أو شعوذة، رقية، عوذة.
**جادووگەر/** ساحر، عَرّاف، مُنَجِّم، مُشَعوذ، دجّال، مُدَعي السحر.
**جادووگەری/** سِحر، عرافة، كهانة، شعوذة، إدعاء السحر، دجل، علم الغيب.
**جاده/** شارع، طريق.
**جار/** مَرّة، نَوْبَة، وجبة، دفعة.
**جاران/** سابقاً، فيما مضى، قبلاً.
**جار بەجار/** بعض المرات، أحياناً، تارةً، من حين لآخر، بين الحين والحين.
**جار جار = جار بەجار.**
**جار ماز/** سجادة الصلاة.
**جاروبار = جار بەجار.**
**جارەها/** مراراً، مرات عديدة.
**جارێ/** لَيس الآن - مرة واحدة، دفعة واحدة.
**جارێک/** مَرّة، مرة واحدة، دفعة واحدة، تارة.
**- ی تر/** ثانية، مرة ثانية، مرة أخرى.
**جارێكیان/** ذات مرةً، مرة ما، في إحدى المرات، مرة سابقة.
**جاری جاران/** سابقاً، الايام الماضية.
**. جار/** حرف موصول بآخر الكلمة تعني محل أو مكان تواجد، مثل **(نێرگس، نێرگسجار)**.





**جاڕ/** إعلان، نداء، إشهار - بقايا المحاصيل المحصودة، مكان يصلح للرعي، مرعى - أرض غير مزروعة منذ مدة.
**جاڕچی/** منادي، دلاّل.
**جاڕدان/** إعلان، إشهار، إذاعة خبر، نشر خبر.
**جاڕدەر = جاڕچی.**
**جاڕڕاهێشتن = جاڕدان.**
**جاڕس/** متضايق، مزعوج، ضَجِر، كَدِر.
**جاڕس بوون/** تضايق وإنزعاج.
**جاڕس كردن/** إزعاج، إقلاق، تعجيز. تضييق.
**جاڕ لێ دان/** وِشاية، تشهير، فَضْحَ.
**جاڕوو/** مزيج من الكلس والرماد لملج جدران الحوض بدلاً من السمنت.
**جاڕووبەند/** مكان مملوح بمزيج من الكلس والرماد.
**جاسووس/** جاسووس، رقيب، سرِّي، مُخبِر.
**جاسووسی/** تجسس، إستطلاع.
**جاش/** جحش، ولد الحمار، كُرّ - عميل، هَوارَة، هَواري، عساكر غير منتظمة.
**جاش ئێستر/** بَغَل صغير.
**جاشك/** جَحش، ولد الحمار، كُرّ.
**جاشولكه/** ولد الحمار، جَحش صغير.
**جاشەكەر/** ولد الحمار، كُر.
**جاكەش/** قَوّاد، سمسير. سمسار.
**جاڵجاڵۆكه/**عنكبوت، ملقاط، عُكاش، هَبور، غَزّال.
**مێیەی جاڵجاڵۆكه/** عَنْكَبة، عنكباء، انثى العنكبوت
**نێرەی جاڵجاڵۆكه/** عنكب، ذكر العنكبوت.
**جام/** قدح، كأس، طاس - زجاج.
**جامانه/** يشماخ، شماخ، عصابة، ربطة.
**جامباز/** وسيط، سمسار - مُخْتَلس، غشّاش، حيّال.
**جامبازه/** وقوف الدواب على القائمتين الخلفيتين.
**جامبازی/** وساطة، سَمْسَرَة - تحايل، حيلة، غش - مضارَبة.
**جامخانه/** جدار من الزجاج.
**جامولكه/** قدح أو طاس أو كأس صغير.
**جامەدانه = جامانه.**
**جامەدانی = جامانه.**
**جامەک/** مرآة، مرايا.
**جامەلووس/** زلق اللسان، مُتَمَلق، مُرائي.
**جامەلووسی/** زلاقة اللسان، مَلَق، رياء.
**جامێر = جەوامێر.**
**جان/** نَفْس، روح، حياة، عمر.
**جانان/** الصديق الحميم، محبوب، حبيب، عزيز.
**جانباز = جامباز.**
**جانبازی = جامبازی.**
**جانبێزار/** نوع من البنادق القديمة.
**جاندار = جانەوەر.**
**جانتا/** حقيبة، شنطة.
**جانفاس/** خَيْش.
**جانگ/** القسم الامامي من الرأس، أطراف الرأس - قماش نسج يدوي.
**جانماز/** سجادة الصلاة.
**جانوو = جوانوو.**
**جانەوەر/** أحياء، حشرات وحيوانات ضارّة، مؤذِ، مُضِر، هامة والجمع هوام.
**جانی = جوانوو.**
**جانی جانان/** محبوب، عزيز، معشوق، حبيب.
**جاو/** خام أسمر ثخين صناعة يدوية محلية.
**جاوونانەوه/** تنظيم الخيوط الطولية (الحابل) في النسيج - كثرة المشي رواحاً ومجيئاً.
**جاوید/** أزلي، أبدي، دائم، خالد، سرمدي.
**جاوین/** مَضْغ، عَلْك، لَوْك.
**جاوینەوه/** مضغ أو عَلْك أو لوك باستمرار، إجترار.
**جاه/** عزة النفس، كرامة، إعتبار، مقام، شرف، كَنَف.
**جاهێڵ/** شاب، فتى، غلام.

**جبه/** جَبَّة، رداء طويل – سلاح، عتاد.

**جبه خانه/** مشجب، مخزن – عتاد، ذخيرة حربية.

**جخار/** هم، غم، قهر.

**جدەو/** خراج وجروح على ظهر ورَقَبَة الخيول، مرض جلدي يصبب ظهر الخيول.

**جرپ/** حركة، تحرك، إنتقال.

**جرپن/** حَرِك، كثير الحركة، مُغامِر، قَلق.

**جرپ وجۆپ/** الحركة الكثيرة وبدون فائدة، حركة قلقة متململة.

**جرت/** الحركة القلقة، ضَجَر، قَلَقْ.

**جرت و فرت = جرپ وجۆپ.**

**جرته/** معطف.

**جرج/** جُرَذ، فأركبير.

**جرووکاندن/** زقزقة، تغريد، صأي، قَصائي، صياح الفرخ.

**جرووکه/** تغريدة، زقزقة، صيحة الفرخ.

**جرووکه جرووک/** الزقزقة المستمرة.

**جرییواندن/** تغريد وصياح الطيور.

**جرییوه/** زقزقة، تغريد، صوت العصافير والطيور – لألأة النجوم.

**جرییوه جرییو/** تلألؤ النجوم – زقزقة واصوات الطيور المتكررة.

**جڕت/** عفطة، زيك، صوت من الفم بسخرية.

**جڕت راهێشتن/** إخراج العفطة أو الزيك، عَفْط.

**جڕت کێشان = جڕت راهێشتن.**

**جڕت لێدان = جڕت راهێشتن.**

**جرو جانەوه/** الحشرات والكائنات الضارة، هامة (الجمع هَوام) – ملابس ومواد متفرقة قديمة وبالية.

**جرو جیاز/** ممتلكات، عوائد، مواد.

**جزدان/** محْفَظة، كيس النقود، كيس الدراهم، معْضَدَة.

**جزم/** جلد، مُجَلَّد، جزء من كتاب، جزء من القرآن.

**جزمه/** جزمة، الحذاء الطويل.

**جزوبەند/** تجليد وتغليف الكتاب.

**جزه/** لحم (لدى الاطفال فقط) – صوت أزّة اللحم – صوت سكب الماء على المعدن المحمر على النار.

**جزه جز/** صوت متواصل لأزّة اللحم على النار.

**جزه هاتن/** صوت احتراق اللحم، أزّة.

**جسن/** أصيل، أصل، سليل أسرة، نوعية جيدة، حسيب، شريف الأصل.

**جفت/** زوج، زوجان، إثنان، إثنتان.

**جفت بوون = جووت بوون.**

**جفته/** كمّاشة أو كلابتين مُدبّبَ الرأس – رَفْسَة، الضرب بمؤخر القدم.

**جفتیار = جووتیار.**

**جڤات/** نقابة، جمعية، تجمع.

**جڤین/** تَجَمُّع، تَحَشُد، إجتماع، تمركز.

**جڤینگه/** مكان، موقع، قاعة التجمع، قاعة الإجتماع.

**جغار = جخار.**

**جغاره/** سجارة.

**جغاره کێش/** مُدَخن السجاير.

**جغاره کێشان/** تدخين، شرب السجاير.

**جقه/** أبو زريق، من الطيور – ريش يوضع على الرأس، تاج – عقدة تشبه الاصبع على ساق بعض الطيور.

**جگ/** عظم البرجمة، وجه عظم البرجمة.

**جگه/** عدا، إلا، فضلا عن ذلك، علاوة على ذلك.

**جگەر/** كَبَد.

**جگەرچی/** بائع المعلاق المشوي.

**جگەر سۆز/** عزيز، مخلص، غيور، أمين، صادق، وَفيّ.

**جگەر سووتان/** موت أحد الأولاد أو أحد المقربين، حُزن وعزاء بسبب موت أحد المقربين، ثَكِل، فقد الولد.





**جگەر سووتاو/** ثاكل، ثكلان، ثاكلة، ثكلى، مسياف، مُسيف، الذي مات ولده، التي مات ولدها.

**جگەر گۆشه/** إبن، إبنة، ضَنى، مخلص، عزيز.

**جگەره/** سجارة.

**جگەرەچی/** صانع السجائر.

**جگەرەخۆر/** مُدَخن، مدخن السجاير.

**جگەرەکێش = جگەره خۆر.**

**جگەرەکێشان/** تدخين، شرب السجائر.

**جگه له/** ماعدا، ماخلا.

**جل/** مَلبس، مايُلبَس، ثوب، هدوم، رداء، كساء.

**– ی چڵکن/** غسيل، الثياب المعدة للغسل.

**– ی شۆراو/** غسيل، الثياب المغسولة.

**جل بەند/** مكان حفظ الملابس، دولاب الملابس، صندوق الملابس.

**جل بڕین/** يوم الاحتفال لاختيار ملابس العروس.

**جل تەسک کردنەوه/** زَمْك الثوب، تصغير أو تقصير الملابس

**جل داکەندن/** خلع أو نزع الملابس.

**جل دان/** صُرَّة الملابس، دولاب أو صندوق الملابس.

**جل دروو/** خياط، درزي.

**جل دروون/** خياطة الملابس.

**جل شتن/** غسل الملابس.

**جل شۆر/** غَسالة، الشخص الذي يغسل الملابس، ماكنة الغَسْل.

**جل شۆرک/** مَغْسَل، مكان غسل الملابس.

**جل قارس کردن = جل تەسک کردنەوه.**

**جلک = جل.**

**جل کار/** بدلة عمل، لباس العمل.

**جل کردن/** عمل الملابس، خياطة الملابس.

**جل گره/** مشْبَك الغسيل.

**جل لەبەرکردن/** إرتداء أو لبس الملابس.

**جل و بەرگ = جل.**

**جله/** سلحفاة البحر، غيلم، حيوان مائي قليل الحركة – اخطبوط.

**جلفر/** أحمق، غبي، بليد، مخربط، غير منظم وغير إداري. «شَلَوڵَو».

**جڵق/** عملة قديمة.

**– ێ ناهێنێ/** لايُساوي أي شيء.

**جڵەو/** عنان، زمام، لجام، سحال.

**جڵەودار/** قائد القافلة.

**جڵەو شل کردن/** إرخاء العنان، تَسَيُّب، تساهل، عدم ضبط الاطفال، عدم الضبط.

**جڵەو کێش/** قائد القافلة، مُسَيطر.

**جڵەو کێشان/** مسك اللجام وسَحب الدابَّة.

**جڵەو گرتن/** منع، صَد، إعاقة، حجر، وقف عند حَدّ.

**جڵەوگییر/** قائد، رئيس، مسيطر – عائق، مانع.

**جڵەوگییری/** مَنع، صَدّ، إعاقة، سيطرة.

**جم/** حركة، إنتقال، سير.

**جمان/** حركة، تحرك، إنتقال، سَيْر.

**جمخار/** ناقوس، جرس الكنيسة.

**جمدان/** شروع بالتحرك.

**جمک/** برج الجوزاء، توأم.

**جمگه/** مفصل، مفصلة.

**جموجۆڵ/** تحركات، إنهماك، ضوضاء، قلق، شَغَب.

**جممه، جمه/** زحام، إزدحام، حشد.

**جممههاتن/** كثير الحشد، إزدحام، لغط، زحام.

**جمێن = جنێو.**

**جمیان = جمان.**

**جنده/** مومس، زانية، عاهرة، أمرأة غير شريفة.

**جندەباز/** هاوي المومسات وبنات الهوى.

**جنده خانه/** دار المومسات، مسكن بنات الهوى والعاهرات.

**جنگر/** عصبي، حاد الطبع، شكس.

**جنۆکه/** جنّ، مارد، غول، جنيَّة.

**جنێو/** شَتيمَة، مَسَبَّة، قذف.

